ڕێکخراوی کوردزاگ

بۆ هۆشیاری نەتەوەیی

# نەورۆزی نـەتەوەیی

**نووسین: ڕێکخراوی کوردزاگ**



# پێشەکی:

بەنــاوی پیــرۆزی خــودای گەورە و تــاکو تەنهــا و گەورەی جیهانیــان.
سڵاوی کورد و کوردستانیانتان لێ بێت.

لەم بـــابەتەدا باســـی نەورۆز و درووســـتبونیمان کـــردووە لەبـــنج و بنەوانـــیەوە بەشـــێوازێکی کـــورت و پوخـــت هەروەهـــا ڕوونکـــردنەوەی وشـــەی نەورۆز هەروەهـــا کەچـــۆن گەشـــتووە بە گەلانـــی دیـــکە، هەروەهـــا وەڵامـــدانەوەی نەورۆز حەرامە یـــان حەڵاڵ؟ لەم بـــابەتەدا بە پشـــت بەســـتن بەچەنـــد بەڵگەیێـــک و ڕای جیـــاوازی خۆمـــان و شـــیکردنەوە و شـــیکاریمان کە جیـــاوازترە لەســـەرجەم ڕایەکـــانی مێـــژوو و لەبـــنج و بنەوانـــیەوە شـــیکردنەوەمان بـــۆ کـــردووە ڕاییێکـــی دروســـت و تایبەتیمان پێداوە.

هیـــوادارین ئەم شـــیکردنەوەیەو شـــیکاریە و لێکـــۆڵینەوەو کـــۆکردنەوەیە لەئاســـتی داواکـــاری نەتەوەییمـــان بـــێ و ڕوحیەتێـــک نـــوێ بکـــا بەبەر کورد و ڕاستکردنەوەی مێژووی ئەم جەژنە نەتەوەییەمان.

## نەورۆز لە رووی زمانەوانیەوە:

ووشـــەی نـــەورۆز وشـــەیەکی پەهلەوانـیە ( پەهلەوانـــی زمـانی پاڵەوانـانە کە ئەم کـوردیەی ئێسـتایە دابەش بـووە بەســەر سـۆرانی و کرمـانجی و لــوڕی و گــۆرانی و کەلهــوڕی، لەهەمووشــیان نزیکتــر لە پەهلەوانــی لوڕیە).

ئەم وشـــەیە لێکـدراوە لە (نـــەو) واتـــای (نــوێ)دەدا (لەکــوردی ئێسـتادا هەروەهـا لەکـوردی باشـوری ئێستاشـدا هەر دەڵـێن نەو یـان نـو) (رۆز) واتــای (رۆژ)دەدا (بەهەمــان شـێوە لەزاراوەی باشــوری بە ڕۆژ دەڵــێن رۆز یــــان روز) پێکــــەوە بەمانــــای (رۆژی نـــــوێ) دێ، بنەرەتــــی ووشـــەکەش لە ئاڤێســـتادا هەیە ووشـــەی نەورۆز بە (**Nava** ) واتـــای (نـــوێ) و (**Razagh**) کە واتـــای (رۆژ یـــان روونـــاکی) دێـــت بەگشـتی واتـای (رونـاکیەکی نـوێ) دەگەیەنێـت، وەك کــەلتورێکی زۆر دێـــرین کـــە لەلایـــەن بەشـــێك لـــە نەتەوەکـــانی زاگـــرۆس بەشـــێوەی جۆربەجۆر پەیڕەو دەکرێت.

نەورۆز: بـــــریتیە لەدوبـــــارە یەکســـــانبوونەوەی شــــــەو و ڕۆژو زاڵبـــونەوەی ڕۆژو ڕونـــاکی بەســـەر تـــاریکی شـــەوداو بـــڕانەوەی ســـەرماو سـۆڵەو درێـژی شـــەوانی زســـتان و کۆتـایی هـاتنی سـاردو سـڕی و سســتی جەســـتە و دەســتپێکردنەوەی وەرزی بەهــاری گەرم و

گـوڕ و وزەو جـۆش و خرۆشـــی وەک گـڕی نەورۆز کەڕەمـزێکە بـۆ ئەو مەبەســتە، هەرچەنـدە ئـاگر بۆخـۆی تـوخم یـان هێمـایەکی پیـرۆز بـووە لای نەتەوەکـانی زاگرۆســی و نیشـانە و ڕەمـزە بـۆ ڕونـاکی دژی تـاریکی و نەزانـی، هەروەهـا هێمـاییێکیش بـووە بـۆ خـۆر یـان ڕونـاکی خـــۆر، چـــونکە لەپـــێش نەورۆزدا تـــاریکی زیـــاترەو زاڵە بەســـەر ڕوناکیـــدا بەڵام لەنەورۆزدا ئەم هاوکێشـــەیە یەکســـان دەبێـــت و مـــاوەی شـــەو و ڕۆژ بەرامـــبەرو یەکســـان دەبـــن لەســـەرجەم گـــۆی زەویـــدا و پاشـــان نەورۆز ســـەرەتا دەبێـــت بـــۆ گـــۆڕینی هاوکێشـــەکەو خـــاڵی وەرچەرخـــان دەبێـــت بـــۆ درێـــژی ڕۆژ لەنیوەگـــۆی بـــاکوری زەویـــداو زیـــاتر مـــانەوەی خـــۆر بەئاســـمانەوە، کە دیـــارە بـــاپیرانی کـــورد هەر لەزووەوە هەســتیان بەم جیـاوازیە کـردووەو بـۆیە ڕۆژێکیـان بـۆ دانـاوە تێیـــدا ئاهەنگیـــان گێـــڕاوە هەر یەکە لە ســـۆمەریەکان و گۆتیەکـــان بەدوای ئەوانیشەوە میتانیەکان ئەو ڕۆژەیان پیرۆز کردووە.

## چۆنیەتی گەیشتنی ئەم ڕۆژە بە گەلانی دیکە:

وەک دیـاره پیـرۆزی خـۆری مێژوویەکـی کـۆنی هەیە لەنێـو گەلانـدا بەتـایبەت لای هورییەکـان و میتانییەکـان و لای ئەوانەوە گەیشـتووە بە میسـرییەکان و ئەخنـاتوون کە بانگەشـەی بـۆ یەکتاپەرسـتی کـردوەو (ئـاتوون) ی بەخـوای تاقـانە دانـاوە کەمەبەسـت پێـی خـۆرە یـان خـۆر ڕەمزێـك بـووە بـۆی کە ئەوەش بەهـۆی شـاژنی میتانیەکـان بـوو کە ژن و ژنخوازی لەنێوان میتانیەکان و فرعەونەکان هەبوو.

هەروەهـا لەفیرعەونەکـان گەیشـتووە بە جولەکەکـان کە ئەوکـات لەمیسـر بـوون و تەوراتـیش بەشـێوەیەکی دروسـت ڕاسـت و ڕەوان کردویەتـی بەسـەری سـاڵ، چـون بـابەتی نەورۆز جەژن و بـۆنەیەکی هەرەمەکـی و لەخـۆوە نـیە بەڵکـو ڕیشـەیەکی مێژوویـی و زانسـتی دروسـتی هەیەو بەڕاسـتی وەرگەڕان و وەرچەرخـانی سـاڵی نـوێیە و لەو کـاتەدا خـۆر دەچێـتە سـەرەتاو یەکەم پـلەی بـورجی (کـۆمەڵە ئەستێرەی) کاوڕەوەو شەو و ڕۆژ یەکسان دەبن.

**بنجی سەرهەڵدانی ئەم ڕۆژە:**

چەنـــد ڕاییێکـــی زۆر دەربـــارەی ئەمە هەیە بەڵام ئـــێمە بەکـــورتی و ڕوونی باسی سەرهەڵدانی ئەم ڕۆژە دەکەین.

ئەمـیش بەسـەرهاتی پێغەمـبەر نـوحە کە لەهەر سـێ ئـایینی ئیسـلام و مەسـیحی و یەهـودی ئامـاژەی پێکـراوە هەروەهـا لە تـابلۆ دۆزراوەکـانی سـۆمەریەکان و بابلیەکـانیش باسـی ئەو بەسـەرهاتە کـراوە، بەپێـی گشـت سـەرچاوەکان پێغەمـبەر نـوح کەشـتیەکەی لە شـاخێکی ئەم جوگرافیـایەی کە ئێسـتا پێـی دەوتـرێ کوردسـتان لەنـگەری گرتـووە بەپێـی ڕای زۆربەی سـەرچاوەکان بـێ ئەو شـاخە شـاخی جـودیە کە لەقورئانیشـدا باسـکراوە بەهەمـان نـاو، هەروەهـا دەربـارەی نـاوی (جـودی) ڕوونـاکبیر و مێژوونووسـی کـورد محمـد ئەمـین زەکـی بەگ دەڵـێ ئەم وشـەیە لەزمـانی کوردیـدا دەبێـتە (کـوتی) کە ئەسـڵی وشـەی کـوردیش دەگەڕێنێـتەوە سـەر ئەم وشـەیە دەڵـێ: کـوتی-کـورتی-کـورد. هەروەهـا بەپێـی ئەو بەڵگـانەی هـاتووە لەقورئانـدا کە جـودی بە مبـارک ناودەبـا ئەوەش واتـای ئەوەیە جێگـاییێکە ڕزق و ڕۆزی لێنەبـڕاوە بـووەو بە پیتـو فەڕ بـووە تـاوەکو ئێسـتاش خـاکی ئەم نـاوچەیەو سـەرجەم کوردسـتان بە پیـت و فەڕەو ڕزق و ڕۆزیێکـی زۆری تێـدایە، ئەوەی ئـێمە بۆیـدەچین ئەوەیە ئەو

ڕۆژەی کەشــتیەکە لەنــگەری گرتــووە بە نەورۆز ناویــان بــردووەو بەواتــای نوێبــوونەوەی ڕۆژ و زەوی هــاتووە هەر لەم ڕۆژەوەش و ئەوەی لەنــوح هــاتووە ئەم ڕۆژەی بە پیــرۆز زانیــوە بەتــایبەتی نەتەوەکـانی زاگـرۆس کەدوای تۆفـانەکە بـووەتە لانـکەی شارسـتەنیەت هەر بــۆیە گۆتیەکــان و ســۆمەریەکانیش پیــرۆزی ئەم ڕۆژەیــان هەڵگرتــووە کە ئەوانــیش بــاپیرانی کــوردن وەکــو مامۆســتا ســۆران حەمەڕەش ئامــاژەی پێــداوە کەواتە بەم شــێوەیە کــورد (یەکەم نەتەوەی زاگـــرۆس) وەچە بەوەچەو نەوە بەنەوە و ئیمپڕاتـــۆر بە ئیمپڕاتـــۆر یــادی ئەم ڕۆژەیــان کــردووەتەوە و بە پیرۆزیــان زانیــووە، لەدوای ئەوانیشــەوە وەکــو ڕوونمــان کــردەوە کە چــۆن بە فیرعەونەکــان گەشـتووە دواتـریش بەیەهودیەکـان کە خـودای گەورە لەتەوڕاتـدا بـۆیە لێـرەدا دەگەیـنە ئەو ئەنجـامەی کە ئەو ڕۆژە لەلایەن خـوداوە بـۆ کـورد پیـرۆز نەکـراوە بەڵکـو ئـێمە خۆمـان لەیەکەم لەنـگەری کەشـتیەکەوە پیرۆزمــان کــردووەو بەڕۆژێکــی گرنگمــان زانیــوە کەواتە دەتــوانین بڵێین جەژنێکی نەتەوەییە و جەژنێکی ئایینی نییە.

لەنەورۆز و بەهــاردا گەلێــک ڕووداو ڕوویانــداوەو ئەم ڕۆژە بەرگــی ئــایینی و سیاســی وەرگرتــووە وەکــو ســەرکەوتنی کەیخەســرەو و مادەکــان بەســەر ئاشــوریەکاندا، یــان ئەفســانەی جەمشــید و کــورش و

کـــاوه بەڵام بەپێـــی بیـــر و بۆچـــوونی ئـــێمه ئەم ڕۆژه زۆر کـــۆنتره له ڕووداوی شکاندنی ئاشوریەکان و ئەفسانەکانی باسیش کراوه.

هەروەهـــا چەنـــد کەســـێک ئەم جەژنه دەلکێـــنن بەم فیرعەونەکـــان و یەهودیەکـــان یـــان فارســـەکان که داهێنـــراوی ئەوان بـــووه بەڵام هـــیچ بەڵگەیێکـــی دیـــاریکراو نیـــیه که داهێنـــراوی ئەوان بـــێ و ســـەرجەم بەڵگەکـــان لەســـەر نەورۆز نـــاڕوونی زۆری تێـــدایه و ئەوەی دەریـــدەخا که دەگەڕێـــتەوه بـــۆ ڕووداوێکـــی زۆر کـــۆن کەســـەرەنجام ســـەرجەمیان دەگەنەوه بەم ڕۆژەی کەشتیەکەی پێغەمبەر نوح لەنگەری گرت.

## نەورۆز لای فیرعەونەکانی مسڕ و یەهودیەکان:

یەکێـــک له ڕۆژه کۆنەکـــانی فیرعەونەکـــان بەنـــاوی "یـــوم الزینـــة" واتـــا (ڕۆژی ڕازانـــدنەوه)، قورئـــانی پیـــرۆز باســـی ئەم ڕۆژەی کـــردووه له ململانێـــی نێـــوان پێغەمـــبەر موســـا ســـەلامی خـــوای لەســـەر بێـــت و فیـــرعەون که تێیـــدا پێغەمـــبەر موســـا ســـەرکەوت بەســـەر فیـــرعەون و سحرەکەیدا، وەک خودای گەوره له سورەتی طه فەرموویەتی:

**(قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ النَّاسُ ضُحًى) ٥٩**

**موسا وتی: کاتی دیاریکراومان ڕۆژی ڕازاندنەوە بێت لەکاتی چێشتەنگاودا خەڵکی کۆبکرێتەوە.**

تـوێژەران ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕۆژی ڕازاندنەوە کە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێکراوە، ڕەنگە جەژنی بەهار بێت (شم النسیم) یان (عید الربیع)، کە جەژنێکی دێرینە لە شارستانیەتی میسری کۆن، خەڵک ئاهەنگیان گێڕاوە، فیرعەون و وەزیر و دەوڵەتمەدارە باڵاکانیش بەشداریان تێدا کردووە، چونکە ئەو جەژنەیە کە تێیدا ژیان زیندوو دەبێتەوە، بۆیە ڕووەکەکان گەشە دەکەن و ئاژەڵەکان بەهێز دەبن، هەروەها ئێمە ڕوونمان کردەوە کە ئەم جەژنە چۆن لە میتانیەکان گەشت بە فیرعەونەکانی مسڕ.

میسرییە کۆنەکان بەکۆمەڵ کۆمەڵ و بە خۆشی و شادییەوە دەچوونە دەرەوە بۆ باخ و کێڵگەکان، وە خوویان وابوو خواردن و خواردنەوەکانیان لەگەڵ خۆیان ببەن، هەروەها ئەو خواردنانەی کە باو بوو لەم ڕۆژەدا (ماسی خوێ، پیاز، کاهوو، گۆشتی قاز و کۆتری برژاو و هێلکە).

بەڵام میسرییەکان هەرگیز ئاگریان نەکردۆتەوە واتا نەورۆزی ئەوان جیاوازبووە لەهی کورد.

یەهودیەکـــان هـــیچ جەژنێکیـــان نـــیە بەنـــاوی نەورۆز بەڵکـــو ئەوەی ئەوان جەژنـــی (الفصـــح) کە ئەو ڕۆژە بەنـــی ئیســـرائیل لەخـــاکی میســـڕ چـوونەتە دەرەوە، پێغەمـبەر موسـا بە بەنـی ئیسـرائیلی ووتـوە یـادی ئەو ڕۆژە بکەنەوە.

کە ئەمـــــڕۆژە بەپێـــــی ڕۆژمێـــــری یەهودیەکـــــان **15** ڕۆژ دوای **21** مارســــــە واتـــــا **15** ڕۆژ دوای جەژنـــــــی نەورۆز ئەم جەژنە دێ کە یەهودیەکـــان تێیـــدا بەڕۆژوو دەبـــن. وە بەم شـــێوەیە لەیەهودیەکـــانەوە گواستراوەتەوە بۆ مەسیحیەکان.

## یـــــادکردنەوەی نەورۆزی کـــــوردی لەئـــــایینی ئیســـــلام حەڵاڵە یـــــان حەرامە؟

بەو پێـــیەی نەورۆز لەنـــاو کـــورد و خـــاکی کـــوردا ســـەریهەڵداوە لای نەتەوەی کــورد هەروەکــو خــۆی مــاوەتەوە بەڵام لای گەلانـــی دیـــکەی جیهـان گـۆڕاوەو بەرگـی ئـایینی و سیاسـی تـایبەتی بەبەردا کـراوە کە دەکـــرێ یـــادکردنەوەی فیرعەونەکـــان یـــان فارســـەکان بەتەواوەتـــی حەرام بـــێ و نەگـــونجێ لەگەڵ ئـــایینی ئیســـلامدا چـــونکە ئەوان وەکـــو جەژنێکـــی ئـــایینی مـــامەڵەی لەگەڵـــدەکەن بەتـــایبەتی فارســـەکان کە بەبەرگـــی ئـــایینی زەردەشـــتی مامـــاڵەی لەگەڵ دەکەن بەڵام کـــورد

بەبەرگێکــی نەتەوەیــی و کــۆنی خــۆی مــامەڵەی لەگەڵــدەکا کە زۆربەی زانایــانی ئیســلامی کــۆکن لەســەر ئەوەی جەژنــی نەتەوەیــی نەورۆزی کــورد حەڵاڵە ئەگەر زیــادەڕەوی تێــدا نەکــرێ، هەروەهــا کــردنەوەی ئــاگر بەمانــای ســەرکەوتنی مرۆڤــایەتی و نەتەوەی کــورد دێ کە لەســەردەمە جیاوازەکــان ســەرکەوتون ئاگریــان کــردۆتەوە لەســەر لــوتکەیێکی بڵنــدی چیــا بــۆ باڵادەســتی و ســەرکەوتنی خۆیــان کە هەر یەکە لە ســۆمەریەکان لە جەژنــی زاگمــۆک و بابلیەکــان لەجەژنــی ئەنکیــدۆ کردوویــانە کە ئەم جەژنــانە بەمانــای سەریســاڵ و نــوێ بــوونەوەی ژیــان هــاتووە لە کلتــوری ســۆمەریەکان و بابلیەکانــدا، هەروەهــا دوای ســەرکەوتنی مادەکــان بەســەر ئاشــوریەکاندا بەهاوبەشــی لەگەڵ بابلیەکــان بەهەمــان شــێوە ئەم ڕۆژە ئاگریــان کردۆتەوە.

لە ئــایینی ئیســلامدا دەتــوانرێ بەهەر بۆنەیێــک بوترێــت جەژن بەڵام جەژنــی ئــایینی نــا کە موســڵمانان تەنیــا جەژنــی ڕەمەزان و قوربانیــان هەیە بەڵام دەتــوانرێ ڕۆژی ڕزگــاری گەلێــک یــان ڕۆژێکــی گرنــگ وەکو (عید) جەژن ناو ببرێت، نەورۆزیش جەژنی نەتەوەییە.

هەروەهــا مامۆســتا (عبــدالکریم حمــادی الــدیان) لەوەڵامێکــدا لە گۆڤــاری (التربیــة الاســلامیة) دەڵێــت: ( امــا تســمیتە عیــدا فلیســت حرامــا ولا

مکروهـــة، الا اذا اعتقـدوا ان ذلـك اليـوم عيـد وضـعة الشـارع) واتـا: ناوهێنـانی بەجەژن حەرام نـیەو مەکـڕوهیش نـیە، تەنهـا لەوکـاتەدا نەبێ کەئەو جەژنە بەجەژنێکی ئاینی خواکرد بزانرێ.

هەروەهـا وشـەی (عیـد) لەلایەن ابـن تیمـیە و ابـن المنظـور و ابـن الاعرابـي و راغـب الاصـفهاني پێناسـەیان بـۆ کـردووە کە کـۆکن لەسـەر ئەوەی عیـد بەمانـای دووبـارە بـوونەوەی بۆنەیێـک دێ لەسـاڵێکدا، هەر بۆنەیێـک دووبـارە ببێـتەوە دەکـرێ پێـی بـووترێ جەژن بەڵام بەجەژنی ئاینی نەچوێندرێ.

زۆربەی کـات، لەمـاوەی حـوکمڕانی ئیسـلامیدا، ئەم بـۆنەیە هەر زینـدوو بـووە، لە پـاڵ هەردوو جەژنە ئـاینییەکەدا بـایەخێکی زۆری پێـدراوەو، لە ڕۆژی (نەورۆز)یشـدا خەڵکـی خـواردن وشـیرینیان بەسـەریەکتردا بەخشـیوەتەوە ئـاهەنگی گەورەشـیان بـۆ سـازداوەو، ڕۆژێکـی ئەوەنـدە خـۆش بـووە، تـا ئەو ڕادەیەی کە (ئیمـامی عەلـی کـوڕی ئەبـو تالیـب) حەزی کـردووە هەمـوو ڕۆژێـك (نەورۆز) بێـت، وەك لە بەرگـی دووەمـی کتێبـی (التراتـب الاداریـة او نظـام الحکومـة النبویة)ی (عبدالحي الکتانی)دا هاتووە کە:

(جـيء الـى علـي بفـالوذج، فاکـل منـه، وقـال مـا هـذا ؟ قـالوا، نـور النیروز، فقال: نوروزنا في کل یوم).

له سـەردەمی ئومەویەكانیشدا، (نەورۆز) كراوەتە سەرەتای ساڵ و باج و دەرامەتی دەوڵەتیش بە پێی سەرەتای ساڵ و لە نەورۆزدا كۆكراوەتەوە.

هەر لێرەشەوە، ئەو ناوچانەی كە لە وەرزی بەهاردا، بەروبوومیان نەدەهاتە بەرهەم و ئامادەی باجدان نەدەبوون، دەیانویست (نەورۆز) نەكرێتە سەری ساڵ یان دوا بخرێت بكەوێتە كۆتایی بەهارو سەرەتای هاوینەوە، كە داواكەشیان جێ بەجێ نە دەكرا، ئەچوون تۆمەت و قسەی ناڕەوایان بۆ (نەورۆز) دەهۆنییەوەو هەڵدەبەست.

ئەم راستی یەش ئاماژەی بۆ كراوە لە لایەن ئیمامی (البیرونی)یەوە لە لاپەڕە (**216 – 217**)ی كتێبی (الاثار الباقیة)دا، كە دەڵێت: (ان الملاك اجتمعوا فی عهد هشام بن عبدالملك الاموي، وشكوا الی عامله (خالد بن عبدالله القسري) و شرحوا له ما یجدوه من الصعاب و سألوه ان یؤخر (النوروز) شهرا فأبی).

هۆی ئەم داوایەشیان ئەوەبوو كە باسمان لێكرد، (د. حسن ابراهیم حسن) لە لاپەڕە (**355**)ی (تاریخ الاسلام)دا دەڵێت: (لان التقویم الجدید قدم یوم النوروز، فكان یجيء، والزرع اخضر فی الوقت الذی یجب ان یدفع فیه الضرائب).

لەسەردەمی عەبباسیەکانیشدا، نەورۆز کراوەتە گرنگترین جەژنی رەسمی، لەم بارەیەوە لەبەرگی دووەمی (تاریخ الاسلام)ی (د.حسن ابراهیم)دا، دەربارەی نەورۆزەوە دەڵێت: (اصبحت من اهم اعیادهم الرسمية فى العصر العباسي الاول).

وەکو (د.کۆنتەر وشنەر) لە کتێبی (احفاد صلاح الدين الايوبي)دا کە لەلایەن (عبدالسلام مصطفى)وە کراوەتە عەرەبی دەڵێت: (لكن عملية اشعال النيران عند الكورد، هى عمليه سياسية بحته، فهي اشاره واضحة على رغبه الكورد في اعلان كونهم شعبا مستقلا بذاته. ولذلك المغزى السياسي تتم مراقبة عملية اشعال النيران و منعها ومطاردة القائمين بها من قبل اجهزة الشرطة والامن فى البلاد المعنية).

لێرەوەو لەهەموو ئەمانەی پێشەوە، بۆمان دەرکەوت کە:

ئاگری نەورۆز رەهەندو ئامازەیەکی سیاسییە، هێمای سەربەخۆیی ناسنامەی نەتەوایەتیمانە.

# کۆتایی:

ئەنجام لێدەگەڕێین بۆ خوێنەران کە خۆیان بڕیار بدەن لەسەر شیکردنەوەکە.